بەرەو واقیعێکی ئیسلامی بەهێزو پێزتر

لە کوردستاندا

٢

چەند رێنموییەک بۆ

# حاڵەتی ئیسلامی

## لە کوردستاندا

بەشی دووەم

برایەتی قووڵ و فراوان و رێز لەبوون و کاری یەکترنان

عەلی باپیر

## بەرەو واقیعێکی ئیسلامی بەهێزوپێزتر

### لە کوردستاندا



### چەند رێنموویی یەك بۆ

# حاڵەتی ئیسلامی

### لە کوردستاندا

بەشی دووەم

| |
|---|
| برایەتی قووڵو فراوانو رێز لەبوونو کاری یەکترمان |

عەلی باپیر

# پێناسەی ئەم زنجیرەیە

الحمد لله وكفى وصلاته وسلامه على عباده الذين اصطفى، خصوصا محمد وآله الكرام وصحبه الشرفاء .

بێگومان بەرەوپێش‌بردنی کاری ئیسلامیو بەهێزوپێزکردنی ئەرکی سەرشانی مسوڵمانانەو ئێمەی مسوڵمانی کوردیش لە کوردستاندا بەتایبەتیو لەهەر جێیەکی دیکەشدا کە بۆمان بلوێ بەگشتی ئەو ئەرکو پێویستی‌یەمان لەسەرشانە. شتێکی ڕوونو ئاشکراشە کە شارەزاییو بەرچاو ڕوونی تێروتەواویش لەهەر کارێکدا هەنگاوی یەکەمو مەرجی سەرەکی سەرگرتنو بەئەنجام گەیشتنیەتی، بۆیە منیش وەك مسوڵمانێکی کورد لە کوردستاندا بۆ جێبەجێ‌کردنی بەشێك لە ئەرکی سەرشانم بەپێویستم زانی لەم قۆناغە گرنگو دژوارەدا کە گەلی کوردی مسوڵمانی پێدا تێدەپەڕێ دەست‌بەکاربم بۆ نووسینی ئەم زنجیرەیە کە خوا پشتیوانبێ ئێوەڕۆکیشی وەك ناوی دەبێتو، دەبێتە بنەماو بنچینەیەك بۆ زیاترو چاکتر گەشەکردنو بەرەوپێش‌چوونی کاری ئیسلامیو هاتنەکایەی واقیعێکی ئیسلامی ڕەسەنترو بەهێزوپێزتر لە کوردستاندا . وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەمڕۆ کوردستان بەگشتی بۆتە جێی سەرنجو تێڕوانینو مەڵبەندێکی گرنگو جێی تەمبەت پێدانی دنیا، بێگومان بەهێزوپێزتربوونی واقیعی ئیسلامی لەوێدا کاریگەرییەکی بەهێزو ڕاستەوخۆی دەبێت بۆسەر جیهانی ئیسلامی بەگشتیو ناوچەکانی دەوروبەر بەتایبەتی .

هەڵبەتە پاش یارمەتی خودای میهرەبانو کاربەجێ ئومێدی زۆریشم بە هەوڵو هیممەتی دڵسۆزانە کە هەرچی زیاتر ئەم زنجیرە باسە دەوڵەمەندترو دامەزراوتر بکەن بەهۆی تێبینیو سەرنج‌ڕاکێشانو پێشنیاری دۆستانەو بنیاتنەرانەیان .

ئیدی دەست لەدەستو بەرەکەت لەخوا .

# پێشەکی

حاڵەتی ئیسلامی کوردستان ـمەبەست کوردستانە بەگشتیو بەتایبەت کوردستانی سەر بەعێراق. بەشێکە لە حاڵەتی ئیسلامی گشتی لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامداو دەنگو ڕەنگو سەنگی هەیە .

جا بێ‌گومان حاڵەتی ناوبراو وەك هەر هەوڵێکی تری مرۆڤ لەکەمو کوڕیو کرچو کاڵی خاڵی‌نیەو پێویستی‌ی بە کردو کۆشی زۆر دەکات بۆ گەیشتنو کامڵبوونی‌و پاشان: «بەرگرتنی» . جا ئەم چەند خاڵەی لە دووتوێی ئەم ئاڵقەیەدا زۆر بەگوشراوی دەیاننووسم هەنگاوێکن بۆ گەیاندنو کامڵکردنی حاڵەتی موبارەكو پڕپیتوپێزی ئیسلامی کە تاقە جێگای متمتانەو ئومێدی جەماوەری مسوڵمانە لە کوردستاندا، بەهیوای ئەوە کە ئەم هەنگاوە هەنگاوێکی پڕخێروبەرەکەت‌بێو بەرهەمداربێو حاڵەتی ئیسلامیش لەوڵاتی کوردستانو هەندەرانیش ڕۆژبۆڕۆژی زیاتر سەقامگیرو دامەزراوو بەرقەراربێ . خودای میهرەبانیشمان بەڵێنی داوە: «والذين جاهدوا فينا لنهديهم سبلنا وان الله لمع المحسنين» العنكبوت(٢٩) .

  

# چەند تێبینییەکی گرنگ

١ـ وەك لەپێشەکیی ئاڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا گوتوومانە: بۆیە باس و لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن دەربارەی بزووتنەوەی ئیسلامیمان کردۆتە ئاڵقەی یەکەم، چونکە بزووتنەوە براگەورەو سەرقافڵەو سێبەری حاڵەتی ئیلامیی‌یە لە کوردستاندا و ساغی و نەخۆشیشی ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر هەموو حاڵەتەکە. جائەوە لەم ئاڵقەی دووەمەشدا ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەموو حاڵەتە ئیسلامیی‌یەکەی کوردستاندا دەدوێین، دوای ئەوەی لەبارەی سەرقافڵەکەیەوە دواین و هەڵمان‌سەنگاند.

٢ـ ئەم نامیلکە هەمووی(١٣) خاڵە ـهەتا ئێستا جانازانم زیاتر دەکات یانا !ـ وە بۆ ئاسانتر خوێندرانەوەو بڵاوکردنەوەی ئەوا جگە لە خاڵی سێزدەم ئەگەرنا هەر دوو خاڵێکمان لێ‌کردۆتە باسێکی سەربەخۆ بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەشی یەکەم: خاڵی(١)و(٢): «چاکتر تێگەیشتنی دین و باشتر ئاشنابوون بەژین».

بەشی دووەم: خاڵی(٣)و(٤): «برایەتی قووڵ و فراوان و ڕێز لەبوون و کاری یەکترنان».

بەشی سی‌یەم: خاڵی(٥)و(٦): «بەجێ‌هێنانی مافی برا لەبەر خوا و نەبوونی دوو هەڵوێستی دژبەیەك و جیا».

بەشی چوارەم: خاڵی(٧)و(٨): «پێ‌لە کرچ و کاڵی خۆنان و دان بەفەزڵ و چاکەی یەکتر هێنان».

بەشی پێنجەم: خاڵی(٩)و(١٠): «تاقە دینەمۆی ئیسلام گیانی بەرەنگاربوونەوەو تەنها ڕێی حوکمڕانیشی توانایی‌و دەسەڵاتدار بوونە» .

بەشی شەشەم: خاڵی(١١)و(١٢): «کۆمەڵو تەوژمە ئیسلامی‌یەکان تەواوکەری یەکترن‌و لەهەموو کەس لەیەك نزیکترن» .

بەشی حەوتەم: خاڵی(١٣): «پێکهێنانی کۆڕێکی ڕاوێژی فراوان کەمترین مەرجی برابوون‌و یەکەمین هەنگاوی یەکبوونە» .

٣- پێشینان گوتوویانە: «دۆست ئەوەیە کە دەتگریێنێ ...» جا بەندە کەم‌وزۆر لەم ڕێنموویی‌یانەدا پەنجە لەسەر نەخۆشی‌و کەم‌وکوڕی‌یەکانی حاڵەتی ئیسلامی لە کوردستان دادەنێ‌و بەناچاری ئاماژەش بۆ کۆمەڵو تەوژمەکانی دەکرێ، هیوادارم هیچ کەسێ لێمان لەدڵنەگرێ‌و مەعنای خراپی لێنەداتەوەو ئەنجامێك کەخۆم نەمویستووە لێی نەگرێ .

٤- لەبەر ئەوەی لەئاڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا«بزووتنەوەی ئیسلامی‌و قۆناغی نوێی» تا ڕاددەیەکی باش بزووتنەوە وەك گۆشتی سەرچەپەرێ خراوەتە گۆڕێ‌و لەتەتەڵەو بێژینگ دراوە، لەم ئاڵقەیەدا کەمتر ڕووی تێکراوەو زیاتر تەئکید لەسەر«حاڵەتی ئیسلامی» کراوە بەگشتی‌و جاروباریش کۆمەڵو تەوژمەکانی بەتایبەت قسەیان لێ‌کراوە.

● ● ●



برایەتی قووڵو فراوانو
ڕێز لەبوونو کاری یەکترنان

# ڕێخۆشکردن

خوێنەری بەڕێز:

ئەم باسە کە بەشی دووەمی«چەند ڕێنموونی‌یەك بۆ حاڵەتی ئیسلامی‌لە کوردستاندا»یە دوو خاڵی سێ‌یەم‌و چوارەم بەناوی(برایەتی قوڵ‌و فراوان)و(ڕێز لە بوون‌و کاری یەکترنان) دەتوژێتەوە، بۆیەش بەدوای باسی یەکەم(چاکتر تێگەیشتنی دین‌و باشتر ئاشنابوون بە ژین)دا ئەم باسەمان هێنایە پێش، چونکە یەکەمین‌و گەورەترین بەرهەمی حاڵی‌بوون‌و شارەزابوونی دین‌و واقیع بریتیە لە پەیدابوونی برایەتی‌و پێکەوە جۆشدان لەناو کۆمەڵگای ئیسلامی‌دا، بەڵام برایەتی ڕاستەقینە نەك هەر ڕواڵەتی‌و ڕووکەشی، بۆیە گوتوومانە(برایەتی قوڵ‌و فراوان)! پاشان لە ئەنجامی برایەتی ڕاستەقینەدا ڕێزو تەقدیر بۆ بوون‌و کارو کردو کۆشی یەکتر پەیدا دەبێ، ئاخر ناگونجێ مسوڵمانان برایەتی‌یان قوڵ‌و فراوانبێ کەچی لەسەر ڕێزو حورمەت لە بیروبۆچوون‌و هەڵوێست‌و کاری یەکتر گرتن کێشەو مشت‌و مریانبێ!! ئەگەرنا ئەو کاتە برایەتی‌یەکەیان پەندی(گۆسەی ڕیش‌پان)ی بەسەردا دەسەپێ.

ئیدی بە هیوای ئەوە کە لە سۆنگەی ئیمانی کامل‌و تەواومانەوە برایەتی‌یەکی ڕاستەقینەی فراوان‌و قوڵ‌و دامەزراومان هەبێ‌و، بێگومان لە ئەنجامی ئەمەش‌دا ڕێزو خۆشەویستی‌و سوپاس‌و پێزانین‌و تەقدیری تەواومان بۆ بوون‌و کارو کۆششی یەکتر دەبێ، کە ئەمەش بناغەی هاوکاری پێکەوەکردن‌و دەستبار بۆ یەکترگرتن‌و سەرەنجامی یەکگرتن‌و یەکبوونیشە.

# خاڵی سێیەم:

# برایەتی قووڵ و فراوان

بەپێی دەیان دەقی قورئانو سوننەت مسوڵمانان لە سەرتاسەری دنیاداو بە درێژایی مێژوو برای یەکترن، بۆ وێنە خوای کاربەجێ لەوبارەوە فەرموویەتی:

١- «انما المؤمنون اخوة...» الحجرات-١٠-.

٢- «والمؤمنون والمؤمنات بعضهم اولياء بعض..» التوبة-٧١-.

٣- «الاخلاء يومئذ بعضهم لبعض عدو الا المتقين» الزخرف-٦٧-.

٤- «ان هذه امتكم امة واحدة وانا ربكم فاعبدون» الانبياء-٩٢-.

پێغەمبەریش(صلى‌اللەعلیەوسلم) لەو بارەوە فەرمایشتی زۆرن بۆ وێنە:

١- «وكونوا عباد الله اخوانا...» متفق عليه.

٢- «المؤمن اخو المؤمن لايظلمه ولايحقره ولايخذله..» رواه مسلم.

٣- «مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى» متفق عليه.

٤- «المؤمن للمؤمن كالبنيات يشد بعضه بعضا» وشبك بين اصابعه. متفق عليه.

دیارە دەزانم کە زۆربەی مسوڵمانان ئەم ئایەتو فەرمایشتانەیان بیستوونو دەیانزانن، بۆیە منیش بە پێویستی نازانم لێرە خۆم بە توێژینەوەو ڕوونکردنەوەیان خەریک بکەم، بەڵام ئەوەی کە لێرەدا بەندە بە شایستەی لێکۆڵینەوەو هەڵوەستە لە ئاقاردا کردنی دەزانێ ئەوەیە کە ئەم(برایەتی - أخوة)یەی کە ئیسلام لە چەندان ئایەتو

فەرمووەدا فەرمانی پێدەکات‌و تەئکیدی لەسەر دەکات دووچاری دوو نەخۆشی بێزرا بووە کە بریتین لە:

أ. سەرکێڵی‌و ڕووکەشی.

ب. تەسکی‌و گچکەبوونەوە.

بەڵێ هەربۆیەش من سەرباسی ئەم خاڵەم ئاوا نووسی:(برایەتی قوڵ‌و فراوان)!!

جا با سەرنجێکی وردی هەرکام لەم دوو نەخۆشی‌یە بدەین کە تووشی«برایەتی» هاتوون، تا بزانین چۆن پەیدابوون‌و بە چیش لادەچن.

جارێ وەك بنچینەیەکی گشتی(قاعدة عامة) دەڵێین: هەرچی(فضائل)ی مسوڵمانانە لە ئیمانەکەیانەوە هەڵدەقوڵێ‌و هەموو(رذائل)یشیان بەهۆی کزی ئیمان‌و تەقوایانەوە پەیدا دەبن، ئەم ڕاستی‌یە جگە لەوەی شتێکی بەرهەست‌و واقیعی‌یەو بە تەجرەبە ئیسپاتبووە سەدان دەقی قورئان‌و سوننەتیش دەلالەتی لەسەر دەکەن، جا با سەیربکەین:

خوای زانا فەرموویەتی: «انما المؤمنون اخوة..» واتە: بە تەئکید بەس براواداران بران، کەواتە بناغەو بنچینەی برایەتی مسوڵمانان ئیمان‌و برواکەیانەو دڵەکانیان بە دەزووی نەپسێنی ئیمان‌و عەقیدە پێکەوە گرێدراون، دەجا بێگومان هەتا ئەو ئیمانە تێرو تەواوترو قووڵترو دامەزراوترو فراوانتربێ، دیارە برایەتی‌یەکیش کە لەسەری بنیات دەنرێ‌و هەڵدەچنرێ تەواوترو قووڵترو فراوانتر دەبێ. هەروەها بە پێچەوانەش.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئیمان بریتیە لە(قەناعەت هێنانی عەقل‌و دڵ‌و دانپێداهێنانی زمان‌و کردەوەی ئەندامەکان) دیارە هەتا هەرسێك هێزی فیکری‌و عاتیفی‌و جەستەیی ئینسان چاکترو زیاتر لەگەڵ ڕاستی‌یەکانی ئیسلامدا تەفاعول بکەن ئیمان کامڵتر دەبێ‌و برایەتیش قوڵترو فراوانتر دەبێ، دەتوانین بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست بڵێین: ڕووبەر(مساحة)ی ئیمان‌و مسوڵمانەتی لە ڕووی فراوانی‌و

تەسکی‌یەوە زیاتر پەیوەستە بە عەقڵ‌و هۆشەوە، قووڵی‌یەکەشی زیاتر پەیوەندی بە دڵ‌و دەروونەوە هەیەو مەحکەمی‌و دامەزراویشی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ کردوکۆشی ئەندامەکان، جا هەتا عەقڵ‌و زەینی ئینسان ئیسلامی فراوانترو هەمەلایەنتر وەرگرتبێ‌و دڵیشی چاکتر ڕاستی‌یەکانی هەزم‌کردبێ‌و چێژتبێ‌و جەستەش چالاکانەترو گورج‌وگۆڵانەتر ئەرکەکانی جێ‌بەجێ‌کردبێ، دیارە ئەو ئینسانە ئیمان‌و دینداری‌یەکەی فراوانترو قووڵترو مەحکەمتر دەبێ‌و هەر ئەو ئیمان‌و مسوڵمانەتی‌یە قووڵ‌و فراوان‌و مەحکەمەش ناچاری دەکات کە برایەتی‌یەکەی بە ئەندازەی تێگەیشتن‌و حاڵی‌بوونەکەی فراوان‌و بەقەدەر هەزم‌کردن‌و چێژوەرگرتنی دڵ‌و دەروونی قووڵ‌و بەبارتەقای کردوکۆش‌و تێکۆشانی مەحکەم دامەزرابێ، هەربۆیەش دەبینین ئەوانەی زیاتر ئیسلامیان بە بیرو هۆش‌و دەزگای عەقڵ وەرگرتووە ئاسۆی بیرکردنەوەیان کراوەترو بازنەی پەیوەندی برایەتی‌یان فراوانترە، ئەوانەش کە زیاتر وەك هەست‌و نەستی عاتیفی‌و دەروونی‌و زیاتر بە دەزگای دڵ دینیان وەرگرتووە بازنەی پەیوەندی برایەتی‌یان گچکەو تەسکە بەڵام بەناخ‌و قووڵایی دڵدا چۆتە خوارێ!!

کەواتە: ئەگەر بمانەوێ هەرچی زیاتر برایەتی‌یەکەمان فراوانترو قووڵترو مەحکەمتر بێت، دەبێ هەوڵبدەین ئیمانەکەمان فراوانترو قووڵترو دامەزراوتربێ بەو شێوەو چۆنیەتی‌یەی کە باسمان کرد.

هەر ئەلێرەشدا دەتوانین دەست لەسەر ماك‌و میکرۆبی هەردوو نەخۆشی‌یە بێزەزایەکەی برایەتی دابنێین‌و بڵێین:

بەهۆی تەنکی‌و ڕۆنەچوونی ئیمان‌و مسوڵمانەتی بە دڵ‌و دەروونماندا برایەتی‌یەکەشمان لەقەدەر ئیمانەکەمانەو شتێکی ڕووکەش‌و سەرکێڵە - الا من رحم ربي ـوە لە سۆنگەی بیرتەسکی‌و گچکە تێگەیشتنمانەوە لە ئیسلام - کە هەر کۆمەڵە بەشێکمان لێ‌وەرگرتووە - برایەتی‌یەکەشمان لە جوغزو بازنەی تەسك‌و گچکە گچکەدا کورت هەڵاتووەو لە ڕووبەرێکی کەمبەری چەند بستی‌دا

کۆتایی پێهاتووه!

بەڵێ بە دەردی پێشینان گوتوویانە:(چعەلەم بێقەڵەم نین)و ئەو برایەتی‌یە کەمڕەنگو ساردوسڕو تەسكو ترووسكو کەمبەرەی ئەمڕۆی مسوڵمانانیش زادەی ئیمانی ساردوسڕو تەسكو گچکەیانەو هەتا زاتی خۆشیان بەبیرکردنەوەو هەستو نەستو دەروونەوە نەگۆڕنو چاك نەکەن، بێگومان واقیعو حاڵی تاڵی ئەو جۆرە برایەتی‌یە بێپەڕوباڵەشیان کە باسمان کرد ناگۆڕن: «ان الله لایغیر مابقوم حتی یغیروا ما بانفسهم..» الرعد-١١..

ئیدی بە هیوای ئەوە زۆری پێنەچێ لەنێو مسوڵمانانی کوردستانو سەرتاسەری جیهانیش‌دا برایەتی‌یەکی ڕاستەقینەی وا بەهۆی ئیمانو مسوڵمانەتی کامڵیانەوە پەیدابێت، کە بازنەو ڕووبەرەکەی هێندە بەرینبێ هیچ لەتکە مسوڵمانێکیش نەمێنێ کە جێگای تێدا نەبێتەوەو، هێندەش قووڵو مەحکەمبێ کە گێژەڵووکەی هیچ کارەساتو ڕووداوێکی جەرگبڕ نەتوانێ هەر بیشی‌هەژێنێ چجای بیلەقێنێ یان-خوانەخواستە- لە ڕەگوڕیشەی دەربێنێ.

پیش‌کۆتایی‌هێنان بە توێژینەوەی ئەم خاڵەش بەچاکی دەزانم جارێکی‌تر گرنگی‌و بایەخی چاکتر تێگەیشتنی دینو باشتر ناسینی واقیعی ژین تەئکید بکەمەوەو بڵێم:

کەسێك یان کۆمەڵێك پێی وابێ ئیسلام بەس فلان بەشەو فیسار لایەنیەتی‌و هیچی‌تر، وە لە تێگەیشتنی هەمەلایەنی‌و ڕاستو دروستی قورئانو سوننەت بۆ ئیسلام دووربێ، یان تێگەیشتبێ بەڵام بەهۆی نەشارەزایی دەربارەی واقیعی ئەمڕۆی دنیاو دەورووبەرەکەی لە جۆرو چۆنیەتی کارکردندا بۆ ئیسلام خلیسکابێ‌و بەسەهووچووبێ یان برابێ، بێگومان نەدەزانێ‌و نە دەشتوانێ ئەو جۆرە برایەتی‌یەش بەرقەرار بکات کە قورئانو سوننەت دەیڵێنو دیارە لە جوغزی تەسکی برایەتی‌یەکی حیزبی‌و دەستەیی‌دا خۆی کورت هەڵدێنێ‌و بۆ

قەرەبووکردنەوەی برایەتی فراوانو قووڵو ڕاستەقینەی ئیسلامیش بە سەدویەك تەئویلی ناشەرعیو بێ‌جێ قەناعەت بەخۆی دێنێو خۆی دەخافڵێنێ یان ڕاستتر بڵێین: دەخەڵەتێنێ!

دیارە ئەو جۆرە هەڵوێستو ڕەفتارەش کاڵایەك نیە تەنیا بە باڵای کۆمەڵێك براببێ، بەڵکو لەنێو هەموو کۆمەڵو تەوژمەکاندا بەزەقی دەبینرێ چکەم چزۆر.

دیارە ئەم قۆناغەش کە حاڵەتی ئیسلامی پێدا ڕەتدەبێ لە کوردستاندا قۆناغێکی یەکجار سەختو گرنگو ناسکە:

سەختە: چونکە لەسایەی باڵادەستی حیزبو لایەنە نائیسلامی‌یەکانو حوکمڕان کردنیاندا خەڵكو جەماوەر لەلایەکەوە دووچاری بارودۆخێکی سەختو لە ووزەدا نەبووی ژیانو گوزەران بوون، کە بە جارێك تەنگی پێ‌هەڵچنیونو پشووی سوارکردوونو هیچ دەرفەتانیشیان نیە، وە لەلایەکی‌ترەوە خەڵكو جەماوەر نائومێدیو بێ‌هیوایی‌یەکی زۆر ڕووی تێ‌کردوون سەبارەت بە دڵسۆزیو لێهاتویی سەرانی سیاسی کوردو چارەسەرکردنیان بۆ واقیعی دژواری سیاسیو ئابووریو نەتەوەیی کوردو نەهێشتنی قەیرانە زۆرو جۆراوجۆرەکانی کوردستان.

وەگرنگە: چونکە خەڵكو جەماوەرێکی زۆر چاوی ئومێدو هیوای بڕیوەتە ئیسلامو ئیسلامی‌یەکانو متمانەو باوەڕێکی زۆریان پێیان پەیدابووە لە ڕووی ڕاستیو پاکیو دڵسۆزی‌یەوەو، زەمینە یەکجار لەبارو ئامادەیە بۆ کردو کۆششو تەقەڵلای هەمەجۆری ئیسلامی‌ی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، بۆ دەستگیرکردنی باوەڕو متمانەی زیاترو چاکتری خەڵكو باوەش‌کردنەوەی زیاتریان بۆ بەدیلی ئیسلامیو پشتگیری‌کردنیو هاوکاری‌کردنی، شتێکی ئاشکراشە کە ئیسلامو غەیری ئیسلامیش بەبێ پەیدابوونو خەملینی بنچینەیەکی جەماوەری

قوولْو فراوان لە شێوەی کۆمەڵگایەکی پێکەوە تەباو جۆشدراودا کە ئامادەی لەباوەش گرتن‌و پیادەکردنی ئەو بەرنامەیە بێت، ناتوانێ بچێتە قۆناغی حوکمڕانی‌و دەسەڵاتی سیاسی‌یەوە، بەتایبەتیش لەم بارودۆخە طاغووتی‌و دژبەخواو ئایینەی ئێستای جیهاندا.

وە ئەو قۆناغە زۆر ناسکە:

چونکە هەروەك چۆن حیزبو کۆمەڵە لائیك‌و نائیسلامی‌یەکان هەرچی کە کاتی‌خۆی لە(شاخ) گوتبوویان‌و نووسیبوویان کە هاتنە شارەکان‌و بەتایبەت دوای پێکهێنانی پەرلەمان‌و حکومەت‌و دەستکردنیان بە حوکمڕانی، هەموو قسەو نووسین‌و شیعارەکانیان لە مەحەکدران‌و ئی‌بن بەڕێیان هاتە سەر بەڕێو لە بوارێدا لاقی ڕەش‌و سپی‌یان دەرکەوت‌و بۆ خۆشیان‌و جەماوەریش کەوتنە گوڕێ. ئێمەی ئیسلامیش پێم‌وایە وردە وردە خەریکین دەچینە نێو تەرازووی هەڵسەنگێنران‌و مەیدانی لە مەحەکدرانەوەو ئەگەر بە زوویی‌و دەست‌گەرمی هەوڵنەدەین لە هەموو ڕووێکەوە بچینە ئاستی ئیسلام، بە تایبەت لە ڕووی برایەتی قوولْو فراوانمانەوە کە یەکەمین‌و گرنگترین هەنگاوی هاوکاری یەکترکردن‌و دەستبار بۆ یەکتر گرتنمانە، بێگومان نە ئێمەش‌و نە هیچ کەسی تریش لە بەرانبەر یاساکانی خوا لە کائیناتی‌دا هەقی(فیتۆ)مان پێ‌نەدراوە‌وئێمەش بەمەرەدی خەڵکی پێش خۆمان دەچین، کە لە حاڵێکی واش‌دا ئێمە ڤیروسیا بەڵام ئیسلامیش ناشیرین دەکەین‌و بە زمانی حاڵو کردار خەڵکی دوور دەخەینەوە!

ئیدی بە هیوای هەوڵو هیمەتی هەموو لایەك.

# خاڵی چوارەم :

# ڕێز لەبوونو کاری یەکترنان

دیارە ئێمە کە دەڵێین: پێویستە مسوڵمانان لەنێو خۆیاندا برایەتی‌یەکی فراوانو قووڵیان هەبێ، مەبەستمان ئەوە نیە کە هەندێکیان لە هەندێکیان بتوێنینەوەو کیانو بوونو کەسایەتی خۆیان لەدەستبدەن، چونکە ئەمە خۆی لە خۆی‌دا دژی برایەتی‌یەو پێچەوانەی ئەو ئامانجو مەبەستەشە کە برایەتی بۆ دانراوە کە بریتیە لە هاوکاری‌کردنی یەکترو بەتەنگ یەکترەوەبوونو دەستبار بۆ یەکترگرتنو یارمەتی‌دانی یەکدی لەسەر چاکەو پارێزکاری، وەك خوای زانا فەرموویەتی: «وتعاونوا علی البر والتقوی..» المائدة-٢-.

بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە مسوڵمانان پێکەوە هەست بە بوونو بازنەو قەوارەی تایبەتی خۆیان بکەنو لەیەکتر جیاو دابڕ دابڕ نەبنو دووچاری دەردی کوشندەی تاقم‌تاقمێنە نەبن، ئەمە لەلایەکەوەو لە لایەکی دیکەشەوە لە قووڵایی‌و ناخی دڵو دەروونیانەوەنەك بە سادەیی‌و سەرکێڵی‌-یەکتریان خۆشبووێو بەزەیی‌و پەرۆشیان بۆ یەکتر هەبێ‌و لەگەڵ یەکتردا هەتا دەتوانن نەرم‌ونیانو لێبووردەو سینگ فراوانبن. وەك خوای مەزن فەرمویەتی: «..أذلة علی المؤمنین..» المائدة-٥٤-وە فەرمویەتی: «..رحماء بینهم..» الفتح-٥٩-.

ئێستاش پاش ئەم برە ڕوونکردنەوەیە، با تۆزێك چەمكو واتای(ڕێز لە بوونو کاری یەکترنان) بتۆژینەوە:

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە تاك تاکی ئینسانەکان خاوەنی بوونو کەسایەتی سەربەخۆی خۆیانو لە ئەسڵی بوونو کەسایەتی‌و ئیعتیباردا هیچ‌کەس ئیمتیازو زیادی بەسەر کەسەوە نیەو مرۆڤەکان هەموویان بەس بە ئەندازەی یەکتر بێ‌کەمو زیاد ئینسانن، هەربۆیەش خوای دادگەر هەندێك جاران مرۆڤایەتی بە کۆمەڵ دواندووەو فەرمویەتی:

«يا بني آدم» يان«يا ايها الناس». تاكو ئينسانەكان بزانن كە ئەسڵو نەژاديان يەكێكەو هەموويان لە ئينسانەتیدا برای یەكترن! وە هەندێك جاريش بە شێوەی تاك ئينسانی دواندوەو فەرمويەتی: «يا أيها الانسان..!» بۆ ئەوەی يەك يەكی مرۆڤەكان هەست بە بوونی سەربەخۆو كەسايەتی تايبەتی خۆيان بكەن، كەواتە: لە ئيسلامدا بە پێچەوانەی ڕێچكەو بيردۆزەكان هەم ڕەسەنايەتی تاكو هەم كۆمەڵيش پارێزراونو دانيان پێدا هێنراوەو هەرجارە يەكێك لە تاكو كۆمەڵ بە قوربانی ئەویتر نەكراوەو لەژێر پێی بەرژەوەندیيەكانیدا نەپلیشێنراوەتەوەو بێسەروشوێن نەكراوە.

جا هەر لەسەر ئەم بنچينەيە، لە كۆمەڵگای ئيسلامیدا هەموو تاكێك چجای هەموو كۆمەڵو تەوژمو چينو توێژێك خاوەنی ڕێزو تەقديرەو مافی دەربڕينی بيروبۆچوونو پێشاندانی هەڵوێستی خۆی هەيە لە سنووری شەرعدا.

وە لە ڕاستیدا جياوازی مسوڵمانان لە بيروبۆچوونو سەليقەياندا بۆ كاری ئيسلامی، نەبۆتە هۆی پەرتەوازەيیو دابڕدابڕبوونيان بە مەرجێك بيروڕايەكانيان لە سنووری شەرع دەرنەچووبنو لەگەڵ دەقەكان(النصوص)ی ئاييندا دژ نەوەستابن وە جياوازی(خلاف)ەكە لە سنووری سروشتی خۆی كە جياوازی بيروبۆچوونو سەليقەيە نەترازابێو نەچووبێتە نێو دڵو دەروونەوەو نەبووبێتە بوغزو كينە بەرانبەر بە يەكتر كە دیارە لە حاڵێكیوادا مەسەلەكە لە جياوازی بيروبۆچوونو(اجتهاد) دەچێتە دەرێو، دەبێتە دژايەتیو ناكۆكیو سەرەنجام سەردەكێشێ بۆ پەرتەوازەيیو لەيەكجيايیو تاقمتاقمێنەش!

بەڵێ خوای كاربەجێو زانا بەرنامەكەی خۆی بە قورئانو سونـنەتەوە وا هەڵخستووە كە جياوازی بيروبۆچوونو(اجتهاد)ەكان ببێتە مايەی گەشەكردنو دەوڵەمەندبوونو بەهێزوپێزبوونی بە شێوەيەك

که بتوانێ وەڵامگۆی هەموو پرسیارەکانی مرۆڤو چارەسارسازی هەموو کێشەو گیروگرفتەکانی تاکیو کۆمەڵی بێت بە درێژایی ڕۆژگارو بە پانایی جیهان!

ئنجا مادام دانبەوەدابنێین کە ئینسانەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ئەسڵی سروشتو ڕەگەزو پێکهێنەرە بنچینەیی‌یەکانی مرۆڤایەتی‌یاندا یەکن، بەڵام هەر کامێکیان کەسایەتی تایبەتیو جیاو سەربەخۆی خۆێ هەیە لە ڕووی جەستەییو عەقڵیو ڕوحی‌یەوە، وە هیچ‌کامیان نوسخەی دووبارەو فۆتۆکۆپی‌ی ئەوی تریان نی‌یە!

وەمادام دانبەوەشدابنێین کە دەقەکانی قورئانو سوننەت مەعناو مەبەستی زۆرو جۆراو جۆر هەڵدەگرنو تێگەیشتنیشیان لەسەر کۆمەڵێكو چینو توێژێکی تایبەت تاپۆنەکراوەو لە ئیسلامدا ڕێگا بە هیچ کەسو کۆمەڵێك نەدراوە تێگەیشتنو ڕاگەیاندنو بەڕێوەبردنی ئایین پاوانبکات بە پێچەوانەی ئایینە شێوێنراوو گۆڕاوەکانی وەك دیانایەتیو جووایەتی.

وە مادام نکوولی ئەو ڕاستی‌یە نەکەین کە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتیو کۆمەڵگاکانی لەیەکتر جیانو بەردەوام گۆڕانیان بەسەردا دێت چبەباری چاکە، چخراپەدا، بەڵێ دانهێنانمان بەم سێ ڕاستی‌یەدا-کە ناتوانین دانیان پێدانەهێنین-ناچارمان دەکات دانیش بەوەدا بێنین کە شێوەی کارو خەباتی ئیسلامی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌ترو لە کۆمەڵگاو ڕۆژگارێکەوە بۆ کۆمەڵگاو ڕۆژگارێکی‌تر نەك هەر دروستە بەڵکو حەتمەن دەبێ لێکجیابنو جۆراو جۆربن، چونکە وەك زانایانی پایەبەرزمان فەرموویان: (الفتوى يختلف زمانا ومكانا وشخصا)، بەڵێ هەروەك چۆن ناگونجێ هیچ کاتو شوێنو کەسێك، بە واتایەکی‌تر هیچ ڕۆژگارو بارودۆخو کۆمەڵگایەك دەقاودەقو کتومت بێ‌کەمو زیاد دووپاتببنەوە، دیارە حوکمو هەڵوێستیش لە بەرانبەریاندا بۆ ئەوەی پڕ بە پێستبێ، دەبێ

هەروابێت. دیارە لێرەدا زیاتر مەبەستمان ئەو مەسەلانەیە کە پەیوەندییان بەو لایەنانەی ژیانی ئیسلامەوە هەیە کە گۆڕانیان بەسەردا دێ وەك لایەنی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووری.

ئنجا ئەو دینەمۆو سەرچاوەیەش کە لە ئیسلامدا دەستەبەر(ضامن)ی دابین کردنی ئەو وەڵامو چارەسەرو هەڵوێستە گونجاوو پڕ بە پێستانەیە لە ئاقار واقیعی گۆڕاودا، بریتییە لە(ئیجتیهاد)، بۆیە داخرانی دەرگای(اجتهاد) بەهەر بەهانەو عوزرێکەوە بێت، وشەیەکی بە ئەدەبە بۆ ڕاگەیاندنی وەفات کردنی ئیسلامو ئینسانو ژیان بەجێهێشتنی!! کە دیارە جگە لە خوای پەروەردگاریش هیچ کەس ئەو مافەی نیە جا هەر کەسێکی دەبێ بابێ!

کەواتە:

مادام سروشتی ئینسانودینو ژین هەرسێکیان گۆڕانکاریو نوێبوونەوە(التجدد) هەڵدەگرن، نابێ قەت لە ئاقار(اجتهاد)و بیروبۆچوونی جیای یەکتردا-لە سنووری شەرعدا-لە بواری کاری ئیسلامی بەگشتیو بە تایبەت کاری ئیسلامی بۆ هێنانەوەو گێڕانەوەی حوکمی ئیسلامیدا هەست بە هیچ جۆرە گرژی(التشنج)و دەمارگیری(التعصب)یێك بکەینو، دەبێ هەروەك چۆن ڕێگا بەخۆمان دەدەین تێگەیشتنو بۆچوونی تایبەتی خۆمانمان هەبێ دەربارەی ئەو مەسەلەو بابەتانەی کە مەودای(اجتهاد)یان تێدا هەیە، پێویستە هەمان هەقو ماف بە غەیری خۆشمان بدەینو، هەروەك چۆن حەزدەکەین خەڵك گوێمان بۆ بگرن دەبێ گوێ بۆ خەڵکیش بگرین، ئەگەرنا وەبەر هەڕەشەی(ویل للمطففین) دەکەوین.

ئێستاش کە بە شێوەیەکی تیۆری(نظري)و مەبدەئی باسی مەسەلەی(ڕێز لە بوونو کاری یەکترنان)مان کرد. بابزانین داخوا چۆن چۆنی دەتوانین بە شێوەیەکی کردەیی(عملي) لە واقیعی

ئێستای کوردستاندا یاسای ناوبراو لە حاڵەتی ئیسلامی‌دا بەڕێوە دەبرێ:

سەرەتا پێویستە بزانین کە: (برایەتی قووڵو فراوان) بنچینەو چاوگی(ڕێز لە بوونو کاری یەکترنان)ە، چونکە کۆمەڵگایەکی ئیسلامی کە ئەندامانی مسوڵمانو دینداری لەسەر بناغەی ئیمانو مسوڵمانەتی(برایەتی قووڵو فراوان)یان لە نێواندابێ، وەك ئەنجامو بەرهەمێکی سروشتی ئەو جۆرە برایەتی‌یە بێگومان ڕێزو تەقدیر لە بوونی یەکترو کارو چالاکی یەکتر دەنێنو چاوی دڵو سەریان بە کردو کۆشو پەرێزو بەرهەمی چاکی یەکتر ڕۆشن دەبێتەوەو چاکەو خێرو خوشی یەکتر بەئی خۆیان دەزانن‌و، ئەوەندەی بۆیان بلوێو بتوانن یەکتر لەسەر چاکە هاندەدەنو دڵی‌یەکتر خۆشدەکەن.

ئاشکرایە کە گەلێك تەوژمو کۆمەڵو لایەنی ئیسلامی پشكو بەشیان هەیە-چ کەمچ زۆر- لە پێکهێنانو خەملاندنی ئەم حاڵەتە ئیسلامی‌یەی کوردستان، کە هەر کامێکیان بیروبۆچوونو ئیجتهادێکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ کاری ئیسلامی لە گۆڕەپانی کوردستاندا.

لەپێش هەموویانەوە-چلە ڕووی کاریگەری‌و چلە ڕووی قەبارەوەو چلە ڕووی جۆراوجۆری مەیدانو بوارەکانی کارو چالاکی‌یەکانی‌یەوە-بزووتنەوەی ئیسلامی‌یە، کە هەر چەندە لە ڕووی کات(زمن)ەوە ڕەنگە لە هەموویان کەمتەمەنتربێت، بەلام لە سۆنگەی ئەوەوە کە وێڕای لایەنی عەقیدەو تەزکیەو فیکرو پەروەردەو شارەزایی شەرعی، سیاسەتی بەرەنگاربوونەوەو ئامادەکردنی هێزو دەسەلاتیشی ڕەچاوکردووە بۆ گۆڕینو چاککردنی واقیعی کۆمەڵگای کوردەواری، وە لەسەداسەد هەڵقوڵاوی ئێشو ژانو موعاناتی خەڵکی مسوڵمانی کوردو ئەزموونێکی واقیعی‌یانەی کۆمەڵگای کوردەواری‌یە. بۆیە بەم تایبەتمەندی‌یانەیەوە(بزووتنەوە) بۆتە پاشکەوتەی پێشکەوتەو لە کاریگەری‌و واقیع‌گۆڕینو دڵپێ‌خۆشکرانو

متمانه پێ کراندا پێش هاوەڵەکانی کەوتۆتەوەو بۆتە سێبەری سەرو قەلاّو پەرژینو قەڵغانو سوپەریشیان.

ئنجا دوای بزووتنەوەی ئیسلامی چ لە ڕووی کاریگەریو پەرێزو چ لە ڕووی قەبارەشەوە (یەکگرتووی ئیسلامی) دێ کە ناوی نوێو خۆماڵی‌یانەی (برایانی مسوڵمان)ە، لە خوا بەزیادبێ ئەمانیش لە ڕووی فیکریو پەروەردەیی‌و ئەخلاقی‌یەوە بەتایبەت، بەشێکی دیارو پشکێکی باشیان لە دروستکردنی حاڵەتی ئیسلامی کوردستاندا هەیەو، -الحمدلله- وردە وردەش هەست دەکرێ بە گەشەکردنو بەرەو پێشچوونو زیاتر قووڵبوونەوەو ئاشنابوونیان بە واقیعی کوردستان، وە ئەو برایانە ئەوەیان باشە هەوڵدەدەن قسەیان لە کردەوەیان زلتر نەبێو چۆنن ئاوا خۆیان پێشانی خەڵك بدەن.

پاشان نۆرەی زانایانی شەرعو ئەهلی طەریقەتدێ، چونکە خەڵكو جەماوەرێکی زۆریان لەگەڵدایە، بەلاّم بەداخەوە چ زانایانی شەرعو چ کارگێرانی طەریقەت، کاریگەریو پشکێکی ئەوتۆیان لەم هۆشیاریو بێداری ئیسلامی‌یەی کوردستاندا نیە، جا هەرچی زانایانی شەرعی نوختە زوعفیان زیاتر کات بەسەرچوونو کۆنبوونی بەرنامەو عەقلی کارو چالاکیانە، کە بۆ ڕۆژگارو واقیعێکی‌تری غەیری ئەم ڕۆژگارو واقیعەمان دەستیان دەداو بە کەڵك دەهاتن، نوختە زوعفی ئەهلی طەریقەتو تەصەووفیش زیاتر دوورییانە لە شارەزایی بە قورئانو سوننەتو بێ‌ئاگایی لە واقیعو بارودۆخی جیهانیو ئیقلیمی ئەم ڕۆژگارە، جا بەهۆی یەکەمیانەوە-واتە نەشارەزایی بە قورئانو سوننەت-گیرۆدەی گەلێك جۆرە بیدعەتو شیركو ئەفسانەسازی بوونو، بەهۆی دووەمیشیانەوە-واتە بێ‌ئاگایی لە دنیای ئەمڕۆ-دووچاری فێڵ‌لێ‌کرانو چەواشەکران بوونو دەبن.

بەلاّم بێگومان هەرکام لە شەرعزانانو ئەهلی طەریقەت لایەنو بەرهەمی باشیشیان هەیەو حاڵەتی ئیسلامی لێیان بێ‌ئیحتیاج نیەو

هەرکامێکیان کەلێنێکیان گرتووەو بۆشاییەکیان لەم حاڵەتە ئیسلامی‌یە پڕکردۆتەوە کە-لەم قۆناغەدا-بەغەیری‌وان پڕنا کرێتەوە، چونکە پڕکردنەوەی میحراب‌و مینبەرەکان لەلایەک‌و وەڵامدانەوەی پرسیارە شەرعی‌یەکانی خەڵکی مسوڵمان‌و ئامۆژگاری کردن‌و ڕێنموونی‌کردنیان لە لایەکی‌ترەوە، دیسان هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوەو زیندووڕاگرتنی دڵ‌و دەروونی خەڵکی بە زیکرو فیکرو تەزکیەو هاندانی خەڵک‌و جەماوەر بەرەو خۆبژارکردن لە(رذائل)و خۆڕازاندنەوە بە(فضائل)و قەبرو قیامەت‌و حیساب‌و کیتاب‌و بەهەشت‌و دۆزەخ خستنەوە یادیان(١)... هەرکام لەمانە ئەرک‌و کارێکی ئیسلامین کە دەبێ لە کۆمەڵگای ئیسلامی‌دا ئەنجام بدرێن.

دیارە غەیری ئەم تەوژم‌و لایەنە ئیسلامی‌یانەش کۆمەڵ‌و لایەنی‌تریش هەن، بۆ وێنە سەلەفی‌یەکان، برایانی(نهضة)... بەڵام ئەو سێ تەوژمەی باسکران ڕۆڵی گرنگ‌و کاریگەر ئەوان دەیگێڕن بەڕیز(ترتیب)ێک کە بۆمان داناون.

شایانی باسە کە کاتی خۆی بەندە قەناعەتی وابوو(سەلەفی‌یەکان) تەوژمێکی سەربەخۆ پێکدێنن، لە(بزووتنەوەی ئیسلامی‌و قۆناغی نوێی)دا ئاماژەم پێ‌کردووە، بەڵام ئێستا قەناعەتم وایە کە(سەلەفی‌بوون) بە مەعنای ڕاست‌و دروستی کە بریتی‌یە لە ڕۆیشتن لەسەر خەت‌و ڕێبازی سەلەفی صالح‌و پابەندبوون بە جۆری تێگەیشتنی ئەوان-کە زیاتر زاناو پێشەوایانی سێ سەدەکانی سەرەتای ئیسلام دەگرێتەوە-دەربارەی قورئان‌و سوننەت چ‌لەبواری عەقیدەو چ‌شەرع‌و چ‌سیاسەتی شەرعی‌و...هتد، بەڵێ سەلەفی‌بوون بەم واتایە

---

(١) دیارە هەموو مسوڵمانێک کەم‌وزۆر ئەم لایەنانەی تێدا هەن، بەڵام ئەهلی طەریقەت بە حیساب دەبێ تێیاندا پسپۆڕبن.

خاڵێکی هاوبەش(قاسم مشترك)ی نێوان هەموو ئیسلامی‌یەکانو شتێك نیە تەنیا بەباڵای هەندێکیان بڕابێ، بەڵام سەلەفی‌بوون بە مەعنای هەڵەی(١) کە جەخت‌کردنە لەسەر هەندێك وردە بابەتی ئیسلام‌و خۆچەسپاندنە بە بڕێك مەسەلەی جوزئی‌و خیلافی‌یەوە لەلایەن کەسانێکەوە کە جارێ بە بنچینە گشتی‌یەکانی ئیسلام ئاشنانین‌و ئەوەی فێرکراون بەس چەند هەڵس‌وکەوت‌و ڕەفتارێکە کە لەنێو کۆمەڵگادا پێ‌ی دەبنە شتێکی نامۆو جێ‌سەرنج‌و سڵەمینەوە، ئەوە بێگومان هەرکەسێك شارەزایی لە قورئانو سوننەتدا هەبێ‌و بە سیرەو ڕێ‌وشوێنی پێغەمبەر(صلی‌الله‌علیه‌وسلم) ئاشنابێت‌و بشزانێ دنیا چباسە، بەکورتی شارەزایی لە دین‌و ژین‌دا هەبێ، ئەو ڕێڕەوە بە دیاردەیەکی نەخۆش‌و هەڵە دەزانێ‌و، دڵنیا دەبێ کە زاناو پێشەوایانی پێشین(سلف)مان زۆر لەوە بەرزو باڵاتر بوون کە دووچاری هەڵەو هەتڵەبوونی ئاوابن.

بۆ ئەوەش کە هیچ‌کەس بە هەڵە لەم قسانەم تێ‌نەگات دەڵێم: بێگومان(دین) لە قورئانو سوننەتدا کورت هەڵاتووەو لەسەر موسڵمان پێویستە لەسەر بنچینەی ئەم دووانە دینداری بکات‌و لە هەموو بوارەکانی دینداری‌دا.بە وردو درشتی‌یەوەمزۆر چاك سەرنج بدات هەر مەسەلەیەك لە چ‌لایەکەوە بەڵگەی شەرعی بەهێزتری لەسەربێت ئەوەیان بگرێ‌و، بەبیانووی ڕێزگرتن لە زاناو پێشەوایانو مەزهەب‌و بیروبۆچوونەکانیان خۆی لە ڕۆشنایی‌و هیدایەتی هەمەلایەنەو بێ‌سنووری قورئانو سوننەت بێ‌بەش نەکات، هەروەك چۆن نابێ بە بیانووی شوێن‌کەوتنی قورئانو سوننەتیشەوە بە

---

(١) کە لەم ڕۆژگارەدا لە کوردستانو غەیری کوردستانیش‌دا باوە.

پێخواسی بەنێوبکەوێو، خۆی دووچاری سەرگەردانیو بێئەدەبیش بەرانبەر بە قورئانو سوننەتو زاناو پێشەوایانیش بکات، بەڵام وریاو دووربینیش بێو فەرع پێش ئەسڵو بناغە پێش دیوار نەخاتو فەرزیش بە قوربانی سوننەت نەکاتو کارێک نەکات کە خانووێک دروستبکاتو شارێک کاولبکات!!

## کۆتایی ئەم بەشەش بەم چەند قسەیە دێنم:

١- ڕێزو تەقدیر هەبوون بۆ بوونو کاریەکتر دژو پێچەوانە نیە لەگەڵ تێبینیو پێشنیارو ڕەخنە ئاراستەی یەکتر کردن بە مەبەستی یەکتر ڕاستکردنەوەو بەرەوپێشبردن، بەڵکو تەواوکەری یەکترن.

٢- نابێ پێمان وابێ برایەتی قووڵو فراوانی ئێمە بەرهەمو ئەنجامەکەی بەس ڕێز لە بوونو کاری یەکترنانو پێکەوە هاوکاریکردنو دەستبار بۆ یەکتر گرتنە، بەڵکو ئەمە لای کەمی ئەنجامو بەرهەمەکەیەتیو کۆتاییەکەشی یەکبوونو یەکخستنی هەموو هەوڵو هەنگاوو دەنگو ڕەنگو سەنگەکانە لە پێناوی سەرخستنی ئیسلامو بالادەستبوونیدا.

٣- دەبێ وریابین گلەییو تێبینی هەبوونمان لەسەر یەکتر نەبێتە هۆی لەیەکتر دووربوونمان، چونکە مسوڵمانان هەتا لە بازنەی ئیماندابن هەر برای یەکترنو ئەرکو مافیان لەسەر یەکتر هەیەو بە لەیەکتر دووربوونیش ناتوانن هەڵەو ناتەواوییەکانی یەکتر چاکبکەن، بۆیە دەبێ هەر پێکەوەو لەگەڵ یەکبنو ئاوێنەی یەکتربنو وەک دوو دەست یەکتر بشۆنو مشووری یەکتر بخۆن.

# ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

خوێنەرە ئیسلامی‌یە خۆشەویستەکانم:

دوای چاپکرانو بڵاوبوونەوەی نامیلکەی(چەند ڕێنمموییەك بۆ حاڵەتی ئیسلامی-بەشی یەکەم)، چەند برایەکی دڵسۆز لە چەند شوێنێکەوە ئاگاداریان کردمەوە کە ئەو سەرنجو تێبینیو ڕەخنانەی دەربارەی برایانی(اخوان)و(سەلەفی)و(صوفی) نووسیومن، کەمو زۆر بوونە هۆی پەیداکردنی نیگەرانیو گلەیی‌یان، وە گوتوویانە: فلانە کەس لەلایەکەوە بانگەشەی یەکگرتنو یەکبوونی کۆمەڵو تەوژمە ئیسلامی‌یەکان دەکاتو، لەلایەکی‌دیکەشەوە ئەو شتانە دەنووسێ!!

بۆیە بە پێویستم زانی لێرەدا ئەم ڕوونکردنەوەیە بنووسمو خوا پشتیوانبێ چەند تەمومژێك لەبەر چاوی ئەووبرایانە بڕەوێنمەوە:

سەرەتا دەڵێم:

هەرکەسێك گرنگی بە شتێك نەداتو بە تەنگی‌یەوە نەبێ دیارە پشت‌گوێی دەخاتو فەرامۆشی دەکات، بەڵام ئەگەر بەلایەوە خاوەنی بایەخو ئەمیەتبوو دیارە هەروا هاکەزایی بەلایدا ڕەت نابێتو هەڵوەستەی لە ئاقاردا دەکاتو مشووری لێ‌دەخوات، کەواتە هەر تەنها قسەکردنو نووسینی بەندە دەربارەی هەرکام لەم کۆمەڵو مسوڵمانانە خۆی لەخۆی‌دا نیشانەی حیساببۆکردنو گرنگی‌پێ‌دانو دڵ‌پێ‌خۆشبوونیانە!

پاشان بەندە کە خۆی لە بازنەی بزووتنەوەی ئیسلامی دایەو ئیجتیهادو شێوازی کاروخەباتی بزووتنەوەی پێ لەئی ئەوانی‌تر چاکترو ڕاست‌ترە، پێش ئەوان باسێکی سەربەخۆو تەرخانی لەبارەیەوە

نووسیەوەو لە هەموو لایەکەوە لەکەووبێژینگی داوەو تەتەڵەی کردووە، بەمەبەستی ڕاستکردنەوەی‌و گەشەپێدانو بەرەوپێشبردنی.

بەڵێ جا لە ڕاستیدا بەندە پێی وایە کە ئەم هوشیاری‌و بێداری‌و ڕاستبوونەوەیەی مسوڵمانان لە کوردستاندا۔هەروەها لە هەر شوێنێکی تری دنیادا۔ ملکی تاپۆکراوی هیچ کەس‌و کۆمەڵێك نیەو ئیهەموو مسوڵمانانەو هەموویان هەم تێیدا بەشدارنو هەم لە بەرامبەریشیدا بەرپرسیارن، جا بەندەش کە هەم لەبارەی بزووتنەوەی ئیسلامی‌یەوەو هەم دەربارەی برایانی(اخوان)و سەلەفی‌و سۆفی‌و مەلاو...هتد شتی گوتووەو دەڵێ‌و نووسیوەو دەنووسێ هەر بەو پاڵنەرەیە کە ئەویش وەك شەخسێکی مسوڵمان خۆی بەرامبەر ئیسلام‌و حاڵەتی ئیسلامی بە بەرپرسیار دەزانێ‌و پەرۆشی‌یەتی‌و بەتەنگی‌یەوەتی‌و، بە کەم‌وکوڕی‌و کرچ‌و کاڵیەکانی دڵتەنگ‌و ناڕەحەت دەبێ‌و، بە چاکبوونو فراژووبوونو بەرەو پێشچوونیش دڵخۆش‌و ئاسوودە دەبێ‌و پێی وایە ئەگەر درێغی‌و کەمتەرخەمی بکات لەو بارەوە خەتایکردووەو گوناحبارە.

ئەگەرنا لە خوا بەزیادبێ لەگەڵ هەرکام لەو کۆمەڵو لایەنە ئیسلامی‌یانەدا چاکترین دۆستایەتی‌و برایەتی لە نێواندا هەیەو تەنانەت جاری واهەیە لەبەر زێدە نزیکی‌و برایەتی‌و پەیوەندی پتەو، لەلایەن هەندێك کەسەوە بڵاوکراوەتەوە کە فلانە کەس بۆتە(اخوان)، یان بۆتە(صوفی)، یان سەلەفی‌یەکی توندە، یان گوتویانە مەزهەبیەکی ئیشکە! بەلام لە ڕاستیدا لەگەڵ ڕێزو تەقدیرم بۆ پەرێزو بەرهەمی چاك‌و شەرعی هەرکام لەم کۆمەڵو تەوژمانە، خۆم بە عایدی هیچکام لەمانە نازانم‌و، ئەو شێوە تێگەیشتن‌و کارکردنە ئیسلامی‌یەی کە بەندە بڕوای پێیەتی زۆر بەزەحمەت لە بازنەی

فراوانی بزووتنەوەی ئیسلامیش‌دا جێگای دەبێتەوە، چجای ئەو جوغزو بازنانەی‌تر کە هەرکامێکیان بەشێك‌و لایەنێکی لە کارو چالاکی ئیسلامی گرتووە!

وەپێم‌وایە ئەو تێبینی‌و رەخنانەش کە لەبارەی هەرکام لەو کۆمەڵ‌و تەوژمە ئیسلامی‌یانەی نێو کوردستان بە بزووتنەوەشەوە خراونەتەڕوو. ئەگەر بە سینگی فراوان‌و گومانی چاكپێبردنەوە وەربگیرێن دەبن بەهۆی بەهێزوپێزتر بوون‌و بەرەو پێش‌چوونی حاڵەتی ئیسلامی بەهۆی ڕاست‌بوونەوەو گەشەکردنی کۆمەڵ‌و تەوژمە پێکهێنەرەکانیەوە، چونکە ئەگەر بێت‌و هەرکام لەو کۆمەڵ‌و لایەنە ئیسلامی‌یانە لایەنە ناتەواوو کرچ‌وکاڵی‌یەکانی خۆی چارەسەربکات، ئەوە هەم خۆی پەرێز پاکترو بەرهەمی چاکتر دەبێ، هەم لەگەڵ لایەنە ئیسلامی‌یەکانی تریش‌دا ڕێگای نزیك‌بوونەوەو برایەتی‌و هاوکاری ئاچووغتر دەبێ، بۆ وێنە: ئەگەر بزووتنەوەی ئیسلامی قیادەکەی سەرڕاست‌ترو ڕەشیدتربێ‌و، بەرنامەیەکی فیکری‌و پەروەردەیی کامڵ‌و ڕوونی هەبێ، سیاسەت‌و ستراژێکی لە ئاستی پێویستی‌دا هەبێت‌و، دوو ئەسڵی گرنگی بەرنامەو ڕاوێژ(المنهج والشوری)ی تێدا دامەزراوتربێ... دیارە هەم خۆی زیاترو چاکتر گەشەدەکات‌و بەرەوپێش دەڕوات‌و کێشەو گیروگرفتەکانی کەمتر دەبنەوەو، هەم لەگەڵ کۆمەڵ‌و لایەنە ئیسلامی‌یەکانی تریش دەتوانێ هەنگاوی باشتر بنێ‌و چاکتر هاوکاری بکات.

هەروەها ئەگەر برایانی(اخوان) حەساسیەتی خۆیان لە ئاقار جەنگ‌و چەك‌و بەرەنگاربوونەوەو...هتددا کەم‌بکەنەوەو نەیهێڵن‌و پلەپلە ئەو چەك‌و واتا شەرعی‌یە ڕەسەنانەش بخەنە پرۆسەی پەروەردەکردن‌و بەرنامەی کارو چالاکی‌یەکانیانەوە، بێگومان هەم

خۆیان بەهێزوپێزترو هەم لەلایەنە ئیسلامی یەکانی تر بەتایبەت بزووتنەوە نزیکتر دەبن!

دیسان هەرکام لە برایانی نهضەو سەلەفی و ئەهلی طەریقەت و مەلایەکانیش بەهەمان شێوە..ئەگەر هەر کامێکیان عەیب و کەم و کوڕیەکانی خۆیان جەریئانە ببینن و بنەبڕ بکەن، بێگومان دەستبەجێ ئەو ساردی و نامۆیی و کەم لوتفی یەی نێوان کۆمەڵ و لایەنە ئیسلامی یەکان کە لە سۆنگەی ناشەرعی و هەڵەو کرچ و کاڵی یەکانیانەوە پەیدابووەو پاشان بەهۆی کەمتەرخەمی و خەم لێنەخواردنەوە پەرەی گرتووە، نامێنێ و لە جیاتی ئەم بازارە ئاڵۆزە کە دزو جەردەی کوفر لێی بەهرەمەند دەبن، بازاڕێکی تر دێتە گۆڕێ.

بە هیوای ئەوەی ئەو برە ڕوونکردنەوەیە توانیبێتی حیکمەتی گوتن و نووسینی ئەو تێبینی و ڕەخنەو پێشنیارانەی بەندە دەربخات، کە جاروبار بە ناچاری ئاماژەیان پێ دەکات.

١٩٩٥-١١-٢٧

